# ڕەخنە و پێشنیار
# بۆ کتێبەکانی بابەتە کۆمەڵایەتیەکان



نوسینی
جهاد خاوەری

## بۆ بەڕێز/ یەکەی سەرپەرشتیکردنی پەروەردەی بنەڕەتی –سیدسادق

## بابەت/ ڕەخنە و پێشنیار

مـــن کـــە نـــاوم " جهـــاد نـــوری تۆفیـــق"ە و مامۆســـتای کۆمەلأیـــەتیم لـــە قوتابخانـــەی "تیـــشك"ی بنـــەڕەتی لـــە شانەدەری. لەساڵی ٢٠١٠دا چەند ڕەخنەیەکم لەم پرۆگرامـە گرت و پێـشکەشی بەرێوەبەرایـەتی پـەروەردەی سیدسادقم کـرد بـەلأم هـیچ کـارێکی پێنـەکرا. ئێـستاش لەسـەر داوای سەرپەرشـتیارەکەم م.نـەوزاد دوبـارە دەسـتم کـردەوە بـە کارەکە بەشێوەیەکی تر کە هەم ڕەخنە بێت لـە پرۆگرامـی وانەی کۆمەلأیەتی (٧-٩) و لەهەمان کاتیشدا پێشنیار بێت.

## پێـشنیارەکانم بـۆ کتێبـەکانی پرۆگرامـی وانـەی کۆمەلأیەتی

بەشێوەیەکی گشتی پێشنیارم ئەوەیـە بـۆ کتـێبی هـەر سێ قۆناغەکە (٧-٩): هاونیـشتمانی لێ لابـبرێـت و بکرێتـە یـەك وانـە و لەگـەڵ مـافی پـۆلی حەوتـدا بخـوێنرێ و مێـژوو و جوگرافیـاش هەریەکـەیان بـۆ وەرزێـك بێـت. هـەروەها قـەبارەی کتێبکـە بکرێتـە A٤ و بەشـێوەیەکی زۆر جـوان دیزاینی بـۆ بکرێـت و لاپـەرەکانی لـەماع و ملـەوەن بێـت و بەوێنـەی ڕون و نەخـشەی جۆراوجـۆر لەسـەر جوگرافیـای

مرۆیی و سروشتی و نەخشەی مێژووی جەنگەکان و نمونەی جوانی شارستانی برازێنرێتەوە.

## ١. کتێبی بابەتە کۆمەڵایەتیەکان ( پۆلی ٧ )

### أ. جوگرافیا

بابەتەکانی زۆر چاك و بەسودن بەلام پێشنیارم ئەوەیە لەڕوی وێنە و نەخشەوە باشتر بکرێ چونکە بابەتەکان بەوێنەی ڕەنگاوڕەنگ باشتر بابەتەکە ڕونتر دەکەنەوە و سەرنجی قوتابی دەبات.

### ب. مێژوو

هەوڵ بدرێ شتەکان سادە بکرێنەوە و ئەوەندە وشك نەبێ قوتابی هەراسان بکا لە لەبەرکردنی ناو و ساڵ و ڕودانی جەنگەکان. هەروەها مێژووی کۆنی هەموو جیهان بێت. مێژووی "هیندیە سورەکان، هیندیەکان، چینیەکان، ژاپۆنیەکان، کۆرياييەکان،..." و زیاتر باس لە کلتور و چۆنیەتی ژیان و دروستکردنی شارستانیەتیان بکرێ. وێنە و نەخشەی جۆراوجۆر و دیمەنی سەرنج ڕاکێشی تێدا دابنرێ.

### ج. هاونیشتمانی:

دارشتنی بابەتەکەی زۆر زۆر لاوازە و قوتابی گرنگی پێنادات، وەکو بابەتەکان جوانن بەلام دارشتن و نوسینی

بابەتەکانی زۆر لاوازن، هەوڵ بدرێ نمونەی زۆر جوانتری تێدا بخرێتە ڕوو.

## ٢. کتێبی بابەتە کۆمەڵایەتیەکان ( پۆلی ٨ )

### أ.جوگرافیا

ناساندنی کیشوەرەکان بەقوتابیان بابەتێکی گرنگە بەلاّم لەئێستادا تەکنەلۆژیا زۆر پێشکەوتووە و هەوڵ بدرێ سەر لەبەری ئەم بابەتە پێیدا بچێرێتەوە، لەدانانی نەخشە و وێنەی ڕونکەرەوە. هەروەها ئەوەی گرنگە دوبارە بونەوەی بابەتەکانە لەهەموو کیشوەرەکانە کە قوتابی توشی تێکەلاّوبونی کیشوەرەکان دەکات و لەکاتی تاقیکردنەوەدا بۆی لەیەك جیانابنەوە. بۆنمونە لەهەموویاندا ئاووهەوا و رشووەکی سروشتی و ئابوری و .... باشترە دیاردە سورشتی و مرۆییەکان لەسەر کیشوەرەکان بکرێ نەك کیشوەرەکان بەپێی دیاردەی سروشتی و مرۆیی بۆ ئەوەی ئەوەندە سەردێرەکان ئەوەندە نەبنە ئالۆزی بۆ قوتابیان.

### ب. مێژوو

شەڕی یەکجار زۆر تیایە و پێشنیارم ئەوەیە شارستانیەتی ئیسلامی تێدا باس بکرێ و پشت بە کتێبی "١٠٠١اختراع" ببەسترێ کە کتێبێکی یەکجار زانستی و پێویستە. هەندێ شتی زیادە و درێژکراوەشی تێدایە لەباسی ژیانی پێغەمبەر و ناوی ناوچە کوردیەکان و ڕاپەرینەکانی.

**ج. هاونیشتمانی**

**بابـــەتی مێـــژوویی تێدایـــە و دوبارەبونـــەوەی بابەتـــەکانی سەرەتای مێـژووی کۆنی پـۆلی حەوتـە بەپێویـستی ئـەزانم چـــاك بکـــرێ زیـــاتر گرنگـــی بـــدرێ بەلایەنـــە پەروەردەییەکانەوە و خۆشویستنی نیشتمان.**

## ٣. کتێبی بابەتە کۆمەلاًیەتیەکان ( پۆلی ٩ )

**أ. جوگرافیا**

**وەکو بابەت شتێکی باشە، بەلاًم پێویستی بە تازەکردنەوە و داتـــای نوێیـــە و هەڵـــەی زۆری تێدایـــە لـــەڕوی داتـــا و بێسەروبەری شێوازی داڕشتنەکانی.**

**ب. مێژوو**

**لایەنی شارستانیەتی عوسمانی و میرنشینەکان بەدیاربخرێ، لەگەڵ گواستنەوەی لایەنی کلتوری ئەو سەردەمە.**

**ج. هاونیشتمانی**

**بابەتێکی قورس و دوور و درێژە هەوڵ بدرێ ئاسان بکـرێ، چـــونکە قوتـــابی وەڕەس دەکـــات لـــە زۆری و قورســـی تێگەیشتنی ئەو بابەتانە.**

## هەڵەکان

## ١. بابەتە کۆمەڵایەتیەکان ( پۆلی ٧ )

### أ. جوگرافیا

*بەشی دووەم

زەوی و پەیوەندی بە گەردونەوە لاپەڕە ١٩:

باس لەوە دەکرێ کە هەوڵەکانی کۆپەرنیکۆس و گالیلۆ یەکەمین هەوڵی خرێتی و سورانەوەی زەویە لەکاتێکدا مەسەلەی نەخشەی جیهان لەلایەن موسڵمانەکانەوە تا ئەوکاتە تەواو کامڵ ببوو لەسەر دەستی شارەزایانی ئەو بوارە وەك خوارزمی و ئیدریسی و تشینگ خە و پیری ڕیس کە من لە لێکۆڵینەیەکدا بەناوی "موسڵمانەکان ئەمریکایان دۆزیەوە و ئەوروپیەکان داگیریان کرد" بەدەرمخستووە. هەروەها بەگەورە نیشاندانی گەشتەکەی "ماجلان" وەك لە لاپەرە ٢١باسی لێوە دەکرێ کە یەکەمین کەس بووە گەشتی بەچوار دەوری جیهاندا کردووە لەکاتێکدا چینیەکان بە سەرکردایەتی دەریاوانی موسڵمان تشینگ خە بەر لەسەدەیەك ئەو کارەی ئەنجام داوە ئەمەش لە نمونەی کتێبەکانی مێژونوس جافین منزیس بەناوی ١٤٢١ و

١٤٣٤كە تیایدا باسی ئەو کاریگەریەی نەخشەی ئەم دەریاوانە دەکات لەسەر هەموو ئەوروپا و شڵەقاندنیان و بردنیان بەرەو ڕێنسانس.
* هەروەها ڕەخنەم لەلاپەرە و وێنەکانێتی کە هیچ جوانیەکیان تێدانیە تەنانەت هەندێ کات ناوی وڵات و شوێنەکانی ئەوەندە وردە کە ناخوێنرێتەوە. وەکو نەخشەی لاپەرە ١٣ یان لاپەرشە ١٦.وێنەی کۆمەڵەی خۆر لاپەرە ٢٠. وێنەی چوار وەرزەی ساڵ لاپەرە ٢٥. هەروەها ناشیرینی کێشانی جۆرەکانی باران لاپەرە ٦٣-٦٥.

**ب. مێژوو**

بابەتەکانی ئەم بەشە زۆربەیان باشن بەڵام دەکرێ باشتر بکرێن لەڕوی ناوەرۆکەوە سادەتر بکرێنەوە چونکە بۆ قۆناغی پۆلی حەوت قورسە.
*چاخەکان ل ١٠١-١٠٦
هەڵەی زۆری تێدایە لەڕوی سەردەمە و چونکە لە ئێستادا لێکۆڵینەوەی یەکجار زۆر ئەنجام دراون کە دەری دەخەن ئەو چاخانە هەڵەن بۆ نمونە چاخی بەردینی ناوەڕاست بە ١٠٠٠٠خەمڵێنراوە بەڵام لە ١١هەزارا شوێنەواری بێستانسوری تیا دۆزرایەوە. یان چاخی بەردینی نوێ بە ٧هەزار خەمڵێنراوە کە

پەرستگا دروستکراوە بەلاّم لە ١٣هەزارا پەرستگا لە کوردستانی تورکیا دۆزرایەوە.

*زەردەشت ل ١٣٢

لەکەیدا دینی میدیەکان بووە زەردەشتی؟ دیاری بکریٚ ئەگەر میدیەکان دینەکەیان وەرگرتووە بوتریٚ لەسەردەمی چ پاشایەکدا بووە. چونکە وەك ئاشکرایە میدیەکان کۆنترن لە ئاینەکە.

*بەندی سێیەم ل١٣٥

سەبارەت بە وشەی کوردستان کەلە سەدەی ١٢هەمدا وتراوە هەڵەیە، چونکە حمدللە مستوفی قەزوینی وتویەتی کەلە سالاّنی (٦٨٢ – ٧٥٠ کـ / ١٢٨١ – ١٣٤٩ز) ئەمەش دەکاتە سەدەی ١٣ و ١٤.

*گرنگترین شوێنەوارەکانی کوردستان ل١٣٦

ئەو شوێنەوارناسانە باس بکریٚ کە لێکۆڵینەوەیان تێداکردووە و هەروا بە هەرەمەکیانە باس نەکریٚ.

*ئەشکەوتی هەزار مێرد و شانەدەر ل١٣٦

لێکۆڵینەوەی تازە ئەنجام دراوە کە هەزارمێرد پێش شانەدەر خراوە هەوڵ بدریٚ کاری لەسەر بکریٚ.

*چەرمۆ ل ١٣٧

لێکۆڵینــەوەی تــازە کــراوە کــە کــۆنترین گونــد نیــە بێستانــسورە هــەوڵ بــدرێ زوو بــەزوو لــە پرۆگرامــدا بگۆردرێ یان لابرێ.

*میلەکەی دەربەندی گاور ل١٣٧

لێکۆڵینــەوەی "ســۆران حمــە ڕەش" لــە کتــێبی "کــورد کێیە" ئاماژەی داوە بە جیایی میلەکەی دەربەندی گاور و ئەوەی مۆزەخانە و دەڵێ دوو شتی جیان هەوڵ بدرێ کار لەسەر ئەو بابەتە بکرێ چونکە ئەو دەیسەلمێنێ کە ئەوەی دەربەندی گاور سەرکردەی کوردە.

*بەنــدی چــوارەم بەشــی یەکــەم و دووەم "ئێرانــی هەخامەنــشی و ئەشــکانی" ئاســانبکرێ و لایــەنی شارستانیان بەدەربخرێ.

*پەندی پێنجەم ل ١٥٤

مێـژووی کـۆنی دۆڵـی نیـل هـەموی زیادەیـە و پێویـست ناکات پێویستە لابرێ تاوەکو چاخە مێژووییەکان.

## ج. هاونیشتمانی

هاونیشتمانی ئەگەر بخرێتە سەر بابەتی ماف باشترە و تەنها لە پۆلی حەوتدا بخوێنرێ.

ســەردێری بابەتــەکانی زۆر باشــن بــەڵام لــەڕووی ناوەرۆکـەوە زۆر لاوازە و جێگـای گرنگیپێـدانی قوتـابی نیە و سەرنج ڕاکێش نیە.

## ٢. بابەتە كۆمەڵایەتیەكان ( پۆلی ٨ )

### أ. جوگرافیا

*دۆزینـەوە جوگرافیـەكان باس بكریَ چونكە بابەتەكـە هەموی لەسەر كیشوەرەكانە و رۆڵـی زانا موسڵمانەكان لــە وێنــەی خــوارزمی و یــەعقوبی و ئیدریــسی و.... بەدەربخریَ هـەروەها دەریاوانـە كارامـەكانی وەكـو ئیـبن ماجــد و تــشینگ خــە و پــیری ڕیــس و ڕۆڵیــان لــە دۆزینــەوەی ناسـاندن و نەخشەكێـشانی كیـشوەرەكان، چونكە دۆزینـەوە جوگرافیـەكان هـەموی لەسـەر دەسـتی موسڵمانەكان بوو و وە دواتر ئیسپانی و پورتوگالیەكان بۆ مەبەستی داگیركاری خۆیان سودیان لیَوەرگرت.

*سـەرژمێریەكان یـان لابـبرێن هـی ئـەو كیـشوەرانە یـان ســالأنە نــویَ بكریَتــەوە نــەوەك تــاوەكو ئیَــستاش سەرژمێری ٢٠٠٤ە.

*بابەتــەكانی ئــاڵۆز كــراون و هــەولَ بــدریَ ســادەتر دابریَژریَتەوە. هـەروەها ئـەو دوبـارە بونەوەیـە چارەسـەر بكــریَ بەتایبــەت مەســەلەی "رووەكــی خۆرســك و ئاووهەوا" كە بەشێكی یەكجار زۆری گرتووە و زۆریشی زیادە هەولَ بدریَ هەر لەسەرەتاوە بەشێوەیەكی گشتی بــاس لــە ئاووهــەوا و ڕووەكــی خۆرســك بكــریَ بەشێوەیەكی گشتی لەسەر ئاستی كیشوەرەكان.

* لایـەنی ئیـداری و سـنوری سیاسـی یـان هـی هـەموو کیشوەرەکان باس بکرێ یان با لەهیچکامیاندا نەبێ.

*نەخـشەکانی جـوانتر بکـرێ و قوتـابی بەئاسـانی ئـەو بابەتەی دەیخوێنێ بتوانێ لەسەر نەخشە بیدۆزێتەوە.

*فیلمـی دۆکیۆمێنتـاری لەسـەر کیـشوەرەکان دروسـت بکـرێ و بدرێتـە مامۆسـتایان تـاوەکو لـەکاتی وانەکانـدا مامۆستا نیشانی قوتابیەکانی بدات.

## ب. مێژوو

هەڵەیەکی یەکجار زۆر زۆری تێدایە کە ئەمە مشتێکە

* لەلاپەرە ٨٠ لە دێری دەیەمدا نوسـراوە :( محمـد د.خ لەم ساڵەدا لەدایك بووە کە دەکاتە ٥٧٠ ی زاینی ).

" وەلامـە ڕاسـتەکەش ئەمەیـە کـە : پێغەمبـەر لـە ١٢ ی ربیع الاول بەرانبەر بە بیستی ئیپریلـی سـاڵی ٥٧١ز لـەو ساڵەی بە ساڵی فیل ناسراوە لەدایك بووە . ( ابن سعد : طبقـات ابـن سـعد ، ج١/ ص١٠٠-١٠١ . ابـن هـشام : سیرة ابن هشام ، ج١ / ص١٨١ ).

لـە لێکۆڵـەرانی نـوێش ڕێگاکـەی مامۆسـتا (مـەحمود پاشا)یە کە مامۆستای ماتماتیکی ناسـراوی میسریە ، کـە یـەکێ لـەو سـاڵانەی لێـی کۆڵیوەتـەوە سـاڵی لـەدایك بـونی پێغەمبـەرە ، ئـەویش بـەم شـێوەیە :( مامۆسـتای ناوبراو لەم باسەدا پشتی بەستۆتە ژمارەکانی ئاسمانی

، وەکو : خۆرگیران . کە ژمارەی جوتبونی ئەستێرەی کەیوان وبارام لە کەڵوی دەمارە کۆڵەدا ، بەپێی ئەمە سەلماندویە کە پێغەمبەر لە ڕۆژی دووشەممەی نۆهەمی مانگی ربیع الاول بەرانبەر بە بیستی ئیپریلی ساڵی ٥٧١ی زاین لەدایك بووە .

* لە لاپەرە ٨٤ نوسراوە : ( ڕۆژی ٢شەممە ١٧ی رەمەزان ڕێکەوتی ٦ / ٨/ ٦١٠ز کتوپڕ کەسێکی لێ پەیدابوو پێی وت : محمد مژدەبێ تۆ بوی بە پێغەمبەری خودا بۆ سەر ئادەمیزاد و منیش جوبرائیلم ). ئەم ڕوداوە کە ڕویداوە بەپێی ئەم کتێبە لە پێش ڕوداوی هاتنە خوارەوەی ئایەتی ( إقرأ بإسم ربك الذي خلق.......) .

" بەڵام ڕاستیەکەی بە پێی سەرچاوەکانی تەبەری ( ٢/ ٢٠٧) و ابن هشام ( ١/ ٢٣٧ – ٢٣٨) ئەوەیە کە پێغەمبەر هیچ شتێکی لەلایەن خوداوە پێ نەوتراوە ، بەڵکو یەکەم دیداری پێغەمبەر و جوبرائیل لە ئایەتی (إقرأ..........) دەست پێدەکات، سەبارەت بەوەش کە دەنگێ هاتبێ و بە محمدی وتبێ تۆ پێغەمبەری خودای ، ئەم ڕوداوە ئەوانەی کەوا گێڕاویانەتەوە گشتیان لەسەر ئەوەن کە لە دوای چونی خەدیجە و پێغەمبەرە بۆ لای وەرەقەی کوڕی نوفل کە مژدەی پێغەمبەری

دەداتــیٚ و پاشــان وەحــی ماوەیــەك دەوەســتیٚ بۆیــە پیٚغەمبــەر دەیــەویٚ کــەوا لــە شــاخیٚکەوە خــۆی هەڵبداتــە خوارەوە نەوەکو خەڵکی وەکو شیٚت و شاعیران سـەیری بکـەن ، بـەلاٚم دەنگـیٚ دیٚـت و دەڵـیٚ : کـە تـۆ پیٚغەمبـەری خودای ........... کە ئەویش جوبرائیل بووە .

* هەر لەهەمان لاپەرەدا باس لەتەمەنی پیٚغەمبـەر کـراوە کـە وەحـی بـۆ هـاتووە ، نوسـراوە : ( پیٚغەمبـەر تەمـەنی ٤٠ ساڵی تەواو کـرد پیٚـی لـە چل و یـەك نـابوو ، وەحـی سروشـی بـۆ هـات ئـەوەش لـە دەوروبـەری سـاڵی ٦١٠ زدابوو).

" ئیٚمــە دوو جــۆر لــە ســاڵمان هەیــە کــە لــە میٚــژوی ئیسلامیدا پشتی پیٚ دەبەستریٚ ، ئەویش ساڵی مـانگی و ســاڵی خۆریــە ، بــەپیٚی هــەردوو جۆرەکــە پیٚغەمبــەر تەمەنی لە چل ساڵ تیٚپەری نەکردووە :

١. بەپیٚی ساڵی مانگی (قەمەری ) پیٚغەمبەر تەمەنی چل ساڵ و شەش مانگ و دوانزە رۆژ بووە .

٢. بە پیٚی ساڵی خۆریش ( شەمسی / زاینی ) سی و نۆ ساڵ و دوانـزە رۆژ بـووە . بڕوانـە ( رحمـە للعـالمین : ١/ ٤٩).

* لــه لاپــەرە (٨٦)دا هــاتووە کــە :( موسـڵمانەکان لــە ماوەی سێ ساڵی بانگەوازی نهێنیاندا زۆر جار لە ماڵی ئەرقەمی کوڕی ئەرقەم بە نهێنی کۆدەبونەوە ).

" وەلاٌمـە راسـتەکەش سـەبارەت بـەناوی کەسـەکەیە کـە هەڵە ناوەکەی نوسراوە ، کە ئەمەش ناوە ڕاستەکەیەتی ( ئەرقەمی کوڕی ئەبی ئەرقەم ).

* لـــە لاپـــەرە (٨٧)دا بـــاس لەمـــە دەکـــات کـــە : ( بتپەرسـتانی قـورەیش زۆر دڵگـران و توڕەبـون کاتێـك بینیان کە پێغەمبەر داوا دەکات کە خوایەك بپەرستن کە چاوەکان نایبینن بەلاٌم ئەو ئەوان دەبینێت و ئاگاداری هەموو شتێکە ).

" بـــەلاٌم وەلاٌمـــی ڕاســـت ئەمەیـــە کـــە : هـــیچ کـــات قوڕەیشیەکان رەددی ئەو خوایەی کەوا پێغەمبەر باسـی لێـوە دەکـرد نەکردۆتـەوە ، ئەمـەش لەلایـەن قورئانـەوە باسـی لێـوە کـراوە کـە ( مـا نعبُـدهُم إلا ليقربونـا إلى الله زلفـى ) . یـاخود ئـەوەی کـەوا لـە (سـيره ابـن هـشام)دا هاتووە ، ئەو شەوەی کەوا بەیانیەکەی شەڕی بەدر بوو ئەبو جەهل دەستی بەرەو ئاسمان بەرز کردەوە و وتی:( اللهم أقتعنا لحرم فأنحاء للغدا ) واتـە :( خوایە هـەر کام لە ئێمە چ من وە چ محمد بوینەتە هۆی پچرانی سیلەی رەحـم سـبەینێ بیـچەمێنەوە ). نـەك باوەڕیـان بـەخودا

هــەبوو ، بــەڵکو قوربانیــان پێــشکەش دەکــرد ، رۆژوی عاشورا موشریکین چەند ساڵ بەر لە پێغەمبەر گرتویانە ، نوێـژیان کـردووە ، حـەجیان کـردووە ، بۆیـە پێغەمبـەر خوایەکی نەناساندووە بەوان کـە ئـەوان نـەیان ناسـیبێت ، بەڵکو ئەوان شـەریکیان بۆ بڕیاردەدا ، هەریەکە لە (لات ، عزاة ، مناة ) یان کردووە شـەریکی خـودا و دەیـانگوت ئەمانە کچانی خودان .

* لەلاپــەرە (٨٨)دا دارشــتنێکی هەڵــە هەیــە لــە باســی کۆچکردن بۆ حەبەشە ، ئەویش بەم شێوازە :( ١٠ پیـاو و ٤ ئـافرەت لـە ڕێگـای دەریـای سـورەوە دەچـنە یەمـەن ئینجا لەوێوە بە سواری کەشتی بازرگانی دەپەڕنەوە بـۆ حەبەشە ، دوای ئەوە ژمارەی کۆچکردووان زیـادی کـرد تا گەیشتە ٨٣ پیاو و ١٧ ئافرەت و چەند منداڵ ).

" کاتیٚ ئەمە دەخوێنیتەوە وا تێدەگەی کـە سـەرەتا (١٤) کەس لە موسڵمانەکان رۆیشتون ، کە بۆ خۆشی ١٤ نیـە بـەڵکو ١٢ پیـاو و ٤ ئـافرەتن ، واتـە دەکەنـە ١٦ کـەس ، پاشان دەنوسریٚ بەرەبەرە ژمارەی موسڵمانەکان زیـادی کــرد بــۆ ٨٣ پیــاو و ١٧ ئــافرەت ، بۆیــە لەمــەوە وا تێدەگەین کە ئەمە بە هەمان کۆچەکەی ترەوە کە پاشـان موسڵمانەکان کردیـان بـۆ مەدینـە کـە دوو ودوو و سـیٚ

سیٚ دەرۆیشتن . بەلاّم ڕاستیەکەی ئەمەیە کە کۆچی حەبەشە لە دوو پۆل پێك هاتووە :

پۆلی یەکەم : بەسەرکردایەتی عوسمانی کوڕی عەففان کە لە ١٢ پیاو و ٤ ئافرەت پێك هاتبوو .

پۆلی دووەم : لە پاش گەڕانەوەی پۆلی یەکەم دێت بۆ مەککە ، پاشان پۆلی دووەم ڕۆیشت بەسەرکردایەتی جەعفەری کوڕی ئەبی تالیب کە ژمارەیان ٨٣ پیاو و ١٧ ئافرەت پێك هاتبوو . بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە ( مختصر سيرة الرسول : شيخ عبدالله نجوي ، ص٩٢ و ٩٣ . ابن هشام : ١/ ٣٦٤).

* لە لاپەرە ( ٩١) نوسراوە : ( پێغەمبەریش یەکێك لە هاوەلاّنی خۆی کە ناوی موصعەبی کوڕی عومەر بوو لەگەڵیان نارد بۆ مەدینە ...........).

" وەلاّمی ڕاست ئەمەیە کە ناوی ئەو هاوەڵە ( موصعەبی کوڕی عومەیر).

# پێش ئەوەی بچەمە سەر بابەتی فتوحاتەکان ، ئەمەویٚ ئەوە بخەمە ڕوو کە هەڵەیەکی زۆر زۆر لە تەواوی ساڵە زاینیەکاندا هەیە ، بۆیە پێم باشە یان ساڵی زاینی لابدەن ، یاخود ڕاستیان بکەنەوە ، چونکە مانای تیا نیە ساڵێکی کۆچی چوار ساڵی زاینی

جیاوازی هەبێت . لێرەدا چەندانە نمونە دەنوسین کە ساڵە کۆچی و زاینیەکان زۆر جیاوازیان تێدایە :

فەتحی شاری دینەوەر کرا لە ٢٠ك/ ٦٤٢ز، بەلاّم بۆ دەست بەسەراگرتنی میسر نوسیویەتی ٢٠ك/٦٤٠ز ، یان دوو ساڵی کۆچی دەبێتە چوار ساڵی زاینی : ٢٠ك/٦٤٠ز ، شەری نەهاوەند ٢٢ ك/ ٦٤٤ز

* لەلاپەرە (١٢٢) نوسراوە : شەڕی یەرموك ( ١٢ك / ٦٣٤ز )

" لە ڕاستیدا سەرچاوەیەکی ڕاست و دروست هەبێت بۆ ساڵی فتوحاتەکان بە پێی لێکۆڵینەوەکانی ئێستا کتێبەکەی (بلاذري: فتوح البلدان )یە ، کە پێی وایە لە مانگی رەجەبی ساڵی ١٥ك / مانگی ئابی ٦٣٦ ئەم شەرە رویداوە بە سەرکردایەتی خالید و لەسەردەمی عومەردا. بلاذري : ص ١٤٠ – ١٤٣ .

* لەلاپەرە (١٢٤) دانوسراوە : شەڕی قادسیە ١٤ك / ٦٣٦ز ، لەلاپەرە (١٢٢)شدا نوسراوە : فەتحی قودس ١٥ك / ٦٣٦ز .

" قوتابی لە ئەنجامی ئەم نوسینە هەڵەوە وا تێدەگات کە یەك ساڵی کۆچی دەکاتە ٢ ساڵی زاینی ، بەلاّم لە ڕاستیدا ساڵەکە بە هەڵە نوسراوە . ئەویش ئەمەیە کە هەردوو فەتحەکان چ فەتحی قودس بێت وەچ فەتحی

قادسیه بێت لە یەك ساڵدا ڕویانداوه ئەویش ١٥ك / ٦٣٦ز .

* هەر لە لاپەره ١٢٤ داو لە باسی شەڕی قادسیەدا نوسراوه : ( موسڵمانەكان ژمارەیان ٤٠٠٠ كەس بوو ).
" بەلاّم ژمارەی موسڵمانەكان لەم شەرەدا ٢٠ هەزار كەس بوو نەك ٤ هەزار كەس . بڕوانه :( بلاذري : ٢٥٥ – ٢٦٢ ، طبري : ج٣ / ٤٨٠ –٥٧٩ . كە باسی شەرەكەی بەدرێژی تێدایه ).

# بەكارهێنانی وشەی (خەلافەت ) لە جێگای ( نیابەت و ئیمارەت ) هەڵەیه ، چونكه لە زمانی عەرەبیدا وشەی ( خەلافەت ) به واتای ( حەماقەت و گێلی ) دێت ، بەلاّم (خیلافەت ) بەواتای ( ئیمارەت و نوێنەرایەتی كردنی خەڵك و ڕابەرایەتی كردنیان ) دێت ، كه دیاره ئێوەش ئەمەتان مەبەسته . لە زمانی عەرەبیدا ئەوترێت : خَلف یخلف ، خلافه : الأمارة = النیابه عن الغیر ، الأمامة . بەلاّم سەبارەت بە خەلافەت : خِلف یخلف خَلافة و خلوفا الغلام ،حمق . بڕوانه : المنجد في اللغة . ٢١

* لەلاپەره (١٤٦) دا هاتووه :( ئومەوییەكان دوو لقن ، لقی بەنو ئومەییە و لقی ئەبیلعاص زۆربەی خەلیفەكانیان لە لقی دووەمن ).

" ئـەم دێـرە بـۆ خـۆی هەڵەیـە : کـە لقـی یەکـەمی (بـەنو ئومەییـە) بێـت ، چـونکە تـەواوی خەلیفـەکان لـە بـەنو ئومەییـەن واتـە کـوڕانی ئومەییـە . بـەلاّم ڕاسـتیەکەی ئەمەیە کە ئومەییە دوو کوڕی هەیە ، ئەوانیش ( حـەرب و ئەبیلعاص )ن . لە حەرب تەنها سێیان بونەتـە خەلیفـە ، وە لە ئەبیلعاصیش دەیـان بونەتـە خەلیفـە ، بەم پێیـە پـۆلی دووەم ڕێـژەیان زۆرتـرە نـەك بـەو شـێوەیەی ئێـوە نوسیوتانە .

* هـەر لـە هـەمان لاپـەرەدا (١٤٦) ، دوو هەڵـەی ترمـان هەیە بەهەمان شێوە ، ئەویش :

١. ڕوخانی دەوڵتی ئومەوی ساڵی ١٣١ك .

٢. خەلیفەکانی ئومەوی ژمارەیان ١٤ خەلیفەیە .

" وەلاّمی ڕاست :

١. ساڵی ڕوخانی دەوڵی ئومەوی ١٣٢ك یە .

٢. خەلیفـەکانیش ١٣ خەلیفـەن . بڕوانـە ( تـأريخ الدولـة الأمويـة ، محاضـرات تـأريخ الأمـم الإسـلامية : الـشيخ خضري بك ، ص٦٤).

* لەلاپەرە (١٤٨)دا نوسراوە : ( یەزیدی کوڕی موعاویە ٦١ – ٦٥)ك .

" ئەم ساڵە بۆ ماوەی خیلافـەتی یەزیـد هەڵەیـە ، چـونکە بـــەپێی زۆرێـــك لـــە سەرچـــاوە ڕەســـەنەکان مـــاوەی

فەرمانرەوایەکەی (٦٠ – ٦٤ )ك یە ، تەنانەت کەسێکی وەك (د. حسن ابراهیم حسن : تأریخ الإسلام ، ج١/ ص٢٢٦) دەڵێ : ماوەی خیلافەتی یەزید ٦٠ – ٦٣ك نەك ٦١ – ٦٥ك کە ئەمە لە هیچ سەرچاوەیەکدا نیە .

* لەلا(١٤٩) نوسراوە :( عەبدولمەلیك چەندین شەڕی لە دژی زوبێر کوڕی عەوامدا ).

" وەڵامی راستیش ئەمەیە : کە ئەم هاوەڵە بەرێزە لە شەڕی جەمەلدا شەهید کراوە ، یەکێك بوو لەوانەی کە شەڕی لەدژی ئیمامی عەلیداکرد . بەڵام ئەوەی ئێوە باسی لێوە دەکەن ناوەکەتان بە هەڵە هێناوە ، ناوی ڕاستی ( عبدالله کوڕی زوبێر کوڕی عەوام )ە .

# لە بەشی دەوڵەتی ئومەویدا دوو وێنە خراونەتە ڕوو کە هەر یەکیان تەعبیر لە یەکێکی تر دەکات نەك ئەوەی ئێوە مەبەستانە ، ئەوانیش :

١. لەلاپەرە (١٤٧) دا وێنەیەکیان دانراوە کە مەبەستتان پێی (موعاویەی کوڕی ئەبوسوفیان )ە . لەگەڵ ئەوەی ئەم وێنانە وێنەی خەیاڵین بەڵام بەو شێوەیەی لێهاتووە کە بۆتە شکلێك بۆ هەریەکە لەوانە کە وەکو وێنەی ڕاستیان بێت ، هەربۆیە پێویستە هەر ئاوا بەشێوەیەکی هەرەمەکیانە وێنە دانەنرێت ، چونکە من دەتوانم زیاتر لە ١٠ سەرچاوە بهێنم لەو کەسانەی کە باسیان لە

(هارون الرشيد ) كردووه ئەم وێنەیەیان بەکاربردووە ، بەڵام ئەم وێنەیەم نەبینیوە بۆ کەسایەتی موعاویە ، بەڵکو ئەویش وێنەی جیای خۆی هەیە .

٢. لەلاپەرە (١٥٢)شدا وێنەیەك دانراوە کە گوایە وێنای خەلیفە ( عومەری کوڕی عەبدولعەزیز ) دەکات ، کە ئەمەش بە هەمان شێوە هەڵەیە چونکە ئەم وێنەیە لەلایەن وێنەکێشە ڕۆژئاواییەکانەوە کێشراوە و مەبەستیانە ( محمد فاتح : کە یەکێکە لە سوڵتانەکانی عوسمانی وەك خوێن ڕێژێك نیشان بدەن ، چونکە روخێنەری دەوڵەتی بیزەنتی بوو لە ڕۆژهەڵاتدا ) . دووەمیش ئەگەر لە وێنەکە دیقەت بگری ئەزانی کە هەندێ لە سەربازەکان تفەنگیان بە دەستەوەیە ، کە ئەمەش بۆ سەردەمی عومەری کوڕی عەبدولعەزیز ناگونجێ . جگە لەمەش مەگەر لە هەموو مێژودا مەشهور نیە کە سەردەمەکەی خەلیفە عومەر کوڕی عەبدولعەزیز تاکە سەردەمە کە شەڕی تیادا ڕاگیرا.

**ج. هاونیشتمانی**

ئەگەر لابرێت باشترە چونکە پرۆگرامی کۆمەڵایەتی مێژوو و جوگرافیا بۆ خۆی پراوپڕە و هەوڵبدرێ مێژوو و جوگرافیاکە بە گیانێکی هاونیشتمانیانە بنوسرێ و

ئەو لایەنەی تێدا بەدەربخرێ باشتر بێت نەك بکرێتە شتێکی جیا و سەربەخۆ.

*قۆناغەکانی گەشەکردنی کۆمەڵگە ل١٧٨-١٨٣ زیادەیە و لە پۆلی حەوتدا لەسەرەتاکانی بابەتی مێژووی کۆندا باسی لێوە کراوە.

## ٣. بابەتە کۆمەڵایەتیەکان ( پۆلی ٩ )

بەشێوەیەکی گشتی پرۆگرامەکە زۆرە و پێویستە کورتر بکرێتەوە.

### أ. جوگرافیا

*پیشەسازی و بازرگانی ل٣٠-٤٢

شوێنێکی زۆری گرتووە و دەکرێ کورتر بکرێتەوە و بەجۆرێکیشی لێبکرێ کە قوتابی بەو جۆرە بیخوێنێ کە سودی لێوەرگرێ چونکە پڕیەتی لە ناوی شار و ناوچە کە قوتابی قەد ناتوانێ زاڵ بێت بەسەریدا.

*لایەنی سەرژمێری عێراق ل٤٢-٤٧

سەرژمێریەکی دروست دیاری بکرێ و تەنها بەناو باس لەسەرژمێریەکانی تر بکرێ تاوەکو قوتابی سەری لێ تێکنەچێ لەو هەموو سەرژمێری و ژمارانە.

پێکهاتەی تەمەنی دانیشتوان ل٤٣-٤٤

ڕێژەیەکی داوە هەڵەیە بۆنمونە:

تەمـەنی بـچوك ٪٤٥ و تەمـەنی ناوەنـد ٪٤٢ و تەمـەنی گەورە ٪٤-٧ هەموی کۆبکەرەوە ناکاتە لە ٪١٠٠ئەمە چ سەرژمێریەکە؟!

*هەرێمی کوردستانی عێراق ل ٤٨-١١٥

کورتر بکرێتـەوە و بابـەت و داتـا و سـەرژمێری زانستی تێدا نیشان بدرێ.

**ب. مێژوو**

هەڵـەی تـایپی زۆر زۆری تێدایـە و چاك بکرێبـۆ نمونـە تەنها لە لاپەرە ١٢٧دا دوو هەڵەی تێدایە

میر ئەسەدەدین کوی مەنگەلاّن کە خۆی میر ئەسـەدەدین کـوری سـیف الـدین. هـەروەها لـە میرنـشینی بـەدلیس نوسـراوە بـە قـسەی جەنگەفخانـەی بەدلیـسی کـە شەرەفخانی بەدلیسیە.

بەیوام ئەو هەڵە تایپیانەی چاك بکرێن چونکە بەڕاستی کتێبی پرۆگرامی خوێندن زۆر نەشیاوە ئەوەندە هەڵـەی زەقی تێدا بێت.

**ج. هاونیشتمانی**

شـوێنێکی زۆری گرتـووە و بـەو هیوایـەی کـورتر بکرێتـەوە سیـستم و زاراوە سیاسـیەکان ئاسـانتر بکرێنەوە بەجۆرێکە قوتابی وەریبگرێ، چونکە بابەتەکە زۆر وشك و جەنجاڵ نوسراوە.

لەکۆتایـدا هیـوام وایـە ئـەم هەوڵـەم بەهــەدەر نـەڕوا و پـــەروەردە ئــاوڕێکی لێبداتــەوە و بــا چــیتر قوتابیـــان بەزانیاری هەڵە تـەڵقین نـەکرێ و زوو بـەزوو چارەسـەری ئەو کەموکوڕیانە بکرێ.

جهاد خاوەری
پسپۆر لە شارستانیەتی ئیسلامی
مامۆستای کۆمەڵایەتی